# تعليم الصبيان التوحيد

## منداڵان فێری تەوحید کردن




دانراوی شێخی ئیسلام

محمدی کوڕی عبدالوهاب رَحِمَهُ اللهُ

وەرگێڕانی

حمزە بەرزنجی

# تعليم الصبيان التوحيد

# منداڵان فێری تەوحید کردن

دانراوی شێخی ئیسلام

محمدی کوڕی عبد الوهاب رَحِمَهُ اللهُ

ساڵی ١٢٠٦ک وەفاتی کردووە

وەرگێڕانی

حەمزە بەرزنجی

بسم الله الرحمن الرحيم

به ناوی الله ی به بەزەیی و میهرەبان

الحمد لله رب العالمين، والصلاة والسلام على سيد المرسلين، وعلى آله أجمعين.

**أما بعد:**

هەموو حەمد و ستایشێک بۆ الله پەروەردگاری جیهانیان وە صەلات و سەلام لەسەر گەورەی نێردراوان وە لەسەر خانەوادە و یاوەرانی تێکڕا.

**پاشان:**

ئەمە پەیامێکی بە سوودە، دەربارەی ئەو شتانەی واجبە لەسەر مرۆڤ منداڵەکان فێربکات پێش قورئان فێرکردنیان، هەتا ببێتە مرۆڤێکی تەواو لەسەر فیترەتی ئیسلام وە تەنها الله پەرستێکی باش لەسەر ڕێگای ئیمان وە بەشێوەی پرسیارو وەڵام ڕێکم خستووە.





**پرسیاری:١/ ئەگەر پێت وترا: پەروەردگارت کێیە؟**

**وەڵام/ بڵێ: پەروەردگارم الله یە.**



**پرسیاری:٢/ مانای پەروەردگار (الرب) چییە؟**

**وەڵام/ بڵێ: خاوەن و پەرستراو و پشتیوان.**

**وە مانای الله: واتە خاوەنی خوایەتی و پەرستراوێتی بەسەر هەموو دروستکراوەکانییەوە.**



## پرسیاری:٣/ ئەگەر پێت وترا: بە چ شتێک پەروەردگاری خۆتت ناسی؟

**وەڵام/ بڵێ:** بە هۆی ئایەتەکانی و دروستکراوەکانییەوە ناسیومە، وە **لە ئایەتەکانی وەک:** شەوو ڕۆژ، وە خۆرو مانگ.

**لە دروستکراوەکانی وەک:** ئاسمانەکان و زەمین و هەموو ئەوانەی تیایدان، وە بەڵگەش لەسەر ئەمە، ووتەی الله یە کە دەفەرموویت: ﴿ إِنَّ رَبَّكُمُ ٱللَّهُ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ يُغْشِي ٱلَّيْلَ ٱلنَّهَارَ يَطْلُبُهُۥ حَثِيثًا وَٱلشَّمْسَ وَٱلْقَمَرَ وَٱلنُّجُومَ مُسَخَّرَٰتٍۭ بِأَمْرِهِۦٓ أَلَا لَهُ ٱلْخَلْقُ وَٱلْأَمْرُ تَبَارَكَ ٱللَّهُ رَبُّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٥٤﴾ ﴾ الأعراف: ٥٤

واتە: بێگومان پەروەردگارتان الله یە کە دروستکاری ئاسمانەکان و زەویە لە ماوەی شەش ڕۆژدا، پاشان بەرزو بڵند بوو وەوە بۆسەر عەرش، بەشەو، ڕۆژ دادەپۆشێت؛ لەکاتێکدا بەشێنەیی عەودالە بەدوایدا، خۆرو مانگ و ئەستێرەکان (هەر هەموویان) بە فەرمانی خوا کەوتوونەتە گەڕو لە فەرمانی دەرناچن،ئاگادار بن و بزانن و تێفکرن کە: هەرچی دروستکردن و بڕیاردانە هەر بۆ ئەوە،(کەواتە دەبا هەمووان فەرمانبەرداری ئەو بین و لە فەرمانی دەرنەچین)، موبارەک و پیرۆزو گەورەیە زاتی (الله) پەروەردگاری جیهانیان.

**پرسیاری:٤/ ئەگەر پێت وترا: بۆ چ مەبەستێک دروستی کردویت؟**

**وەڵام/ بڵێ: بۆ پەرستنی بە تەنها بە بێ هاوبەش بۆ بڕیاردانی، وە گوێڕایەڵی کردنی بە ئەنجامدانی ئەوەی ئەو فەرمانی پێ کردووە، وە واز هێنان لەوەی ئەو نەهی لێ کردووە. هەروەک الله تە عالا دەفەرمووێت:** ﴿وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ٥٦﴾ الذاريات: ٥٦

**واتە: بێگومان من پەری و ئادەمیزادم دروست نەکردووە تەنها بۆ ئەوە نەبێت کەمن بپەرستن و فەرمانبەردارم بن.**

**وەک دەفەرمووێت:** ﴿إِنَّهُۥ مَن يُشْرِكْ بِٱللَّهِ فَقَدْ حَرَّمَ ٱللَّهُ عَلَيْهِ ٱلْجَنَّةَ وَمَأْوَىٰهُ ٱلنَّارُ﴾ المائدة:٧٢

**واتە: دڵنیابن ئەوەی شەریک و هاوبەش بۆ خوا بڕیار بدات، ئەوە بێگومان خوا بەهەشتی لەسەر حەرامکردووە و شوێن و جێگاو سەرەنجامی ئاگرە.**

**وەک دەفەرمووێت:** ﴿وَٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ وَلَا تُشْرِكُوا۟ بِهِۦ شَيْـًٔا﴾النساء:٣٦

**(ئەی خەڵکینە) تەنها الله بپەرستن و هیچ جۆرە شەریک و هاوەڵێکی بۆ بڕیار مەدەن.**

وە شیرکیش گەورەترین گوناهێکە سەرپێچی الله ی پێ کراوە.

وە هاوبەش دا نانیش: بریتییە لەوەی هاوبەشێک بۆ الله بڕیار بدرێت لێی بپاڕێتەوە و ئومێدی پێی هەبێت یان لێی بترسێت یان پشتی پێ ببەستێت یان ئومێدی پێی هەبێت لە غەیری الله، وە غەیری ئەمانە لە جۆرەکانی عیبادەت(پەرستش).

پەرستش: ناوێکی کۆکراوەیە بۆ هەموو ئەو شتانەی الله خۆشی دەوێت و پێی ڕازییە لە ووتەکان و کردەوە شاراوەکان و ئاشکراکان.

وە لەوانە پاڕانەوە: الله دەفەرمووێت: ﴿ وَأَنَّ ٱلْمَسَٰجِدَ لِلَّهِ فَلَا تَدْعُوا۟ مَعَ ٱللَّهِ أَحَدًا ﴿١٨﴾ ﴾ الجن: ١٨

واتە: دڵنیابن کە: مزگەوتەکان تایبەتی الله ن، دەبێت هەر ئەوەی تێدا بپەرسترێت و ناوی کەسی تر نەکرێتە شەریك و هاوتای ناوی ئەو زاتە.

وە بەڵگەش لەسەر ئەوەی هاوار کردن لە غەیری الله کوفرە، وەک الله دەفەرمووێت:﴿ وَمَن يَدْعُ مَعَ ٱللَّهِ إِلَٰهًا ءَاخَرَ لَا بُرْهَٰنَ لَهُۥ بِهِۦ فَإِنَّمَا حِسَابُهُۥ عِندَ رَبِّهِۦٓ ۚ إِنَّهُۥ لَا يُفْلِحُ ٱلْكَٰفِرُونَ ﴿١١٧﴾ ﴾ المؤمنون: ١٧

واتە: ئەو کەسەی خوایەکی تر بڕیار بدات و بیکاتە شەریکی خوا، لە کاتێکدا کە هیچ بەڵگەیەکی بە دەستەوە نیە، ئەوە بە ڕاستی حساب و

لێپرسینەوەی لای پەروەردگارێتی، بێگومان بێ باوەڕ و خوا نەناسان سەرفراز نابن.

لەبەر ئەوەی پاڕانەوە لە گەورەترین جۆرەکانی پەرستشە، هەروەک پەروەردگارتان فەرمویەتی: ﴿وَقَالَ رَبُّكُمُ ٱدۡعُونِيٓ أَسۡتَجِبۡ لَكُمۡۚ إِنَّ ٱلَّذِينَ يَسۡتَكۡبِرُونَ عَنۡ عِبَادَتِي سَيَدۡخُلُونَ جَهَنَّمَ دَاخِرِينَ ٦٠﴾ غافر: ٦٠

واتە: ئەی خەڵکینە پەروەردگارتان فەرموویەتی: ئێوە هانا و هاوار بۆمن بهێنن؛ ئەوە من دوعا و نزاتان گیرا دەکەم، بەڕاستی ئەوانەی خۆیان بەگەورە دادەنێن و لووت بەرزی دەکەن لەئاستی پەرستنی مندا، لە ئاییندەدا بەسەرشۆڕی و خەجاڵەتی یەوە دەخرێنە ناو ئاگری دۆزەخەوە.

وە لە سونەندا هاتووە لە ئەنەسەوە بە مەرفوعی: پاڕانەوە مۆخی عیبادەتە.

وە یەکەم شتێک کە الله فەرزی کردووە لەسەر عەبدەکانی بریتییە لە بێ باوەڕ بوون بە تاغوت و ئیمان هێنان بە الله، الله تەعالا دەفەرمووێت: ﴿وَلَقَدۡ بَعَثۡنَا فِي كُلِّ أُمَّةٖ رَّسُولًا أَنِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ وَٱجۡتَنِبُواْ ٱلطَّٰغُوتَۖ﴾ النحل: ٣٦

واتە:سوێند بە الله بێگومان ئێمە لە ناو هەر گەل و نەتەوەیەکدا پێغەمبەرێکمان ڕەوانەکردووەو پێمان ڕاگەیاندووە کە پێیان بڵێت: تەنها الله بپەرستن، خۆتان دوورە پەرێز بگرن لە هەموو پەرستراوێکی تر.



**تاغوت:** ئەوەیە کە جگە لە الله بپەرسترێت، یان شەیتان و فاڵچی و ئەستێرەناس و ئەو کەسەی حوکم بکات بە غەیری ئەوەی الله دایبەزاندووە، وە هەموو ئەو کەسانەی خەڵک شوێنیان کەوتوون و گوێڕایەڵیان دەکەن لەسەر غەیری حەق.

**پێشەوا ئیبن القیم** ڕەحمەتی الله ی لێ بێت فەرمویەتی: تاغوت: ئەوەیە کە بەندە لە سنووری خۆی دەربچێت لە پەرستراو یان شوێنکەوتوو یان گوێڕایەڵی کراو.



## پرسیاری:٥/ ئەگەر پێیان وتیت: دینت چییە؟

وەڵام/ دینم ئیسلامە.

**وە مانای ئیسلام:** تەسلیم بوون بە الله بە تەوحید و ملکەچ بوون بۆی بە گوێڕایەڵی و دۆستایەتی موسڵمانان و دوژمنایەتی هاوبەشدانەران.

الله تەعالا دەفەرمووێت:﴿ إِنَّ ٱلدِّينَ عِندَ ٱللَّهِ ٱلۡإِسۡلَٰمُۗ ﴾ آل عمران: ١٩

واتە: بەڕاستی دین و ئاینی پەسەند لای الله تەنها ئاینی ئیسلامە،



وه دەفەرمووێت: ﴿وَمَن يَبۡتَغِ غَيۡرَ ٱلۡإِسۡلَٰمِ دِينٗا فَلَن يُقۡبَلَ مِنۡهُ﴾ آل عمران: ٨٥
واتە: جا ئەوەی بێجگە لە ئاینی ئیسلام پەیڕەوی هەر ئاینێکی تر بکات لێی وەرناگیرێت.

وه بە صەحیحی لە پێغەمبەرەوە ﷺ ریوایەت کراوە کە فەرمویەتی: (أنْ تَشْهَدَ أن لا إله إلا اللهُ وأنَّ محمداً رسولُ اللهِ ، وتُقِيمَ الصَّلاَةَ، وتُؤْتِيَ الزكاةَ، وتصومَ رمضان، وتحُجَّ البيتَ إن اسْتطعْتَ إليه سَبِلاً)
واتە: ئیسلام ئەوەیە کە شایەتمان بهێنیت بەوەی هیچ پەرستراوێک نییە بە هەق جگە لە الله، وه محمد نیردراوی الله یە، وه نوێژ بەرپا بکەیت و زەکات بدەیت و ڕۆژووی ڕەمەزان بگریت و حەجی بەیت ئەنجام بدەیت ئەگەر توانات هەبوو.

وه مانای لا اله الا الله: واتە هیچ پەرستراوێک نیە بە هەق جگە لە الله، هەروەک الله تەعالا دەفەرمویێت: ﴿وَإِذۡ قَالَ إِبۡرَٰهِيمُ لِأَبِيهِ وَقَوۡمِهِۦٓ إِنَّنِي بَرَآءٞ مِّمَّا تَعۡبُدُونَ ٢٦ إِلَّا ٱلَّذِي فَطَرَنِي فَإِنَّهُۥ سَيَهۡدِينِ ٢٧﴾ الزخرف: ٢٦- ٢٧
واتە: ئەو کاتە بیهێنەوە یاد کە ئیبراهیم بە باوکی و هۆزەکەی خۆی وت: بەڕاستی من دوورە پەرێزم لەو شتانەی کە ئێوە دەیپەرستن(٢٦). جگە لەو زاتەی کە دروستی کردووم، هەر ئەویش ڕێنموویم دەکات و دەمخاتە سەر ڕێگەی ڕاست و دروست. ئەوسا ئیتر ئەو بەرنامەی تەوحیدەی هێشتەوە بۆ

هۆزو گەلانی دوای خۆی، بۆ ئەوەی ئەوانیش بگەڕێنەوە بۆ سەر ئەو بیروباوەڕە ڕاستە(٢٧).

**وە بەڵگەش لەسەر نوێژ و زەکات: الله دەفەرمووێت:** ﴿وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مُخۡلِصِينَ لَهُ ٱلدِّينَ حُنَفَآءَ وَيُقِيمُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَيُؤۡتُواْ ٱلزَّكَوٰةَۚ وَذَٰلِكَ دِينُ ٱلۡقَيِّمَةِ ٥﴾ البينة: ٥

**واتە: فەرمانیشیان پێنەدرابوو جگە بەوەی کە الله پەرستی بکەن و بەپاکی و دڵسۆزی و ملکەچی فەرمانبەرداری ئاین و بەرنامەکە بن و لابدەن لە هەموو ئایینێك و تەنها پابەندی ئایینی ئیسلام بن، نوێژیش بەڕێك و پێکی ئەنجام بدەن، زەکاتیش لە ماڵ و سامانیان دەربکەن، ئەوەیە ئاینی ڕاست و بەنرخەکانی الله.**

**لەم ئایەتەدا سەرەتا بە تەوحید و بەری بوون لە شیرک دەست پێ دەکات: گەورەترین شتێک کە الله فەرمانی پێ کردووە بریتییە لە تەوحید، وە گەورەترین نەهییەک کە ڕێگری لە ئەنجامدانی کردووە بریتییە لە شیرک، وە فەرمانی کردووە بە ئەنجامدان و بەرپا کردنی نوێژو زەکاتدان، ئەمەش زۆربەی دینەو ئەوانەی تر لە شەرائیعەکان شوێنکەوتەی ئەمەن.**

**بەڵگەش لەسەر فەرزێتی ڕۆژوو.. الله تەعالا دەفەرمووێت:** ﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ كُتِبَ عَلَيۡكُمُ ٱلصِّيَامُ كَمَا كُتِبَ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِكُمۡ﴾ **إلى**

قوله: ﴿ شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ هُدٗى لِّلنَّاسِ وَبَيِّنَٰتٖ مِّنَ ٱلۡهُدَىٰ وَٱلۡفُرۡقَانِۚ فَمَن شَهِدَ مِنكُمُ ٱلشَّهۡرَ فَلۡيَصُمۡهُۖ ﴾ البقرة: ١٨٣ - ١٨٥

واتە: ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە ڕۆژووی ڕەمەزان لەسەرتان پێویست کراوە هەر وەکو لەسەر گەلانی پێش ئێوە پێویست کرابوو(١٨٣)... هەتا دەفەرمووێت: مانگی ڕەمەزان (ئەو مانگەیە) کە قورئانی تیادا هاتۆتە خوارەوە، لەکاتێکدا ئەم قورئانە ڕێنموویی بەخشە بە خەڵکی و بەڵگەی زۆری تیادایە، لە ڕێنموویی و جیاکردنەوەی ڕاست و ناڕاست و حەق و ناحەق، جا کەسێك لە ئێوە مانگی ڕەمەزانی بینی یان هەواڵی بینینی پێدرا، دەبا ئەو مانگە بەڕۆژوو بێت(١٨٥)..

بەڵگەش لەسەر فەرزێتی حەج.. الله تەعالا دەفەرمووێت:﴿ وَلِلَّهِ عَلَى ٱلنَّاسِ حِجُّ ٱلۡبَيۡتِ ﴾ آل عمران: ٩٧

واتە: جا الله تەعالا بڕیاریداوە لەسەر خەڵکی حەج و سەردانی بیت الحرام بکەن بە تەنها ئەوانەی کە تواناى (دارایی و تەندروستیان) هەیە،

وە بنچینەکانی ئیمان شەشن:

ئەوەیە بڕوا بهێنیت بە الله و مەلائیکەتەکانی و کتێبەکانی و پێغەمبەرانی و ڕۆژی دوایی و بڕوا بهێنیت بە قەدەر خێر و شەڕی.

بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەو فەرمودەیەیە کە لە صەحیحدا هاتووە و عومەری کوڕی خەطاب دەیگێڕێتەوە.

## پرسیاری:٦/ ئەگەر لێیان پرسیت: پێغەمبەرت کێیە؟

وەڵام/ بڵێ: پێغەمبەرمان محمدی کوڕی عبد الله ی کوڕی عبد المطلبی کوڕی هاشم کوڕی عبد منافە.

الله تەعالا لە ناو قورەیشدا هەڵی بژارد کە ئەوانیش پاکەکانی نەوەی ئیسماعیلن، وە ڕەوانەی کرد بۆ لای سوور و ڕەش، وە کیتاب و حیکمەتی بۆ دابەزاند بانگەوازی خەڵکی کرد بۆ بە پاکی عیبادەت ئەنجام دان وە واز هێنان لەوەی لە غەیری الله دەیانپەرست: لە بت و بەرد و درەخت و پێغەمبەران و پیاوچاکان و مەلائیکەت و غەیری ئەوان.

بانگەوازی کردن بۆ واز هێنان لە شیرک و هاوبەشدانان وە جەنگی لەگەڵ کردن تا وازی لێ بهێنن وە تەنها پەرستش بۆ الله ئەنجام بدەن، وەک الله تەعالا دەفەرموێت:﴿ قُلۡ إِنَّمَآ أَدۡعُواْ رَبِّي وَلَآ أُشۡرِكُ بِهِۦٓ أَحَدٗا ٢٠ ﴾ الجن: ٢٠
واتە: پێیان بڵێ: من هەر بەردەوام دەبم و هەر بانگەواز دەکەم بۆ لای پەروەردگارم، کەسیش ناکەمە هاوەڵ و شەریکی.

وە دەفەرموێت:﴿ قُلِ ٱللَّهَ أَعۡبُدُ مُخۡلِصٗا لَّهُۥ دِينِي ١٤ ﴾ الزمر: ١٤

واتە: بڵێ: من تەنها هەر خوا دەپەرستم و ملکەچ و فەرمانبەرداری ئاین و بەرنامەکەی ئەو دەبم

وە دەفەرمووێت:﴿ قُلْ إِنَّمَآ أُمِرْتُ أَنْ أَعْبُدَ ٱللَّهَ وَلَآ أُشْرِكَ بِهِۦٓ إِلَيْهِ أَدْعُواْ وَإِلَيْهِ مَـَٔابِ﴾ الرعد: ٣٦

واتە: پێیان بڵێ: بەڕاستی من فەرمانی ئەوەم پێ دراوە کە تەنها خوا بپەرستم و هیچ شەریك و هاوەڵێشی بۆ بڕیار نەدەم، هەر بۆ لای ئەو خەڵك بانگ بکەم، گەڕانەوەش هەر بۆ لای ئەوە.

وە دەفەرمووێت:﴿قُلْ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ تَأْمُرُوٓنِّىٓ أَعْبُدُ أَيُّهَا ٱلْجَٰهِلُونَ ٦٤ وَلَقَدْ أُوحِىَ إِلَيْكَ وَإِلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبْلِكَ لَئِنْ أَشْرَكْتَ لَيَحْبَطَنَّ عَمَلُكَ وَلَتَكُونَنَّ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ٦٥ بَلِ ٱللَّهَ فَٱعْبُدْ وَكُن مِّنَ ٱلشَّٰكِرِينَ ٦٦﴾ الزمر: ٦٤ - ٦٦

واتە: ئەی پێغەمبەر ﷺ بڵێ: ئەی نەفامەن، دەتانەوێت و فەرمانم پێدەکەن کەجگە لە خوا شتی تر بپەرستم؟!(٦٤). سوێند بە الله با دڵنیابن کە وەحی و نیگا نێردراوە بۆ تۆ و بۆ ئەوانەی پێش تۆش: ئەگەر هاوەڵگەر بیت و شەریک بۆ خوا بڕیار بدەیت کاروکردەوە چاکەکانیشت پووچە و دەچیتە ڕیزی خەسارەتمەند و زەرەرمەندانەوە(٦٥). نەخێر بەگوێیان

ەکە، کەواتە هەر تەنها خوا بپەرستە و لە دەستەی سوپاسگوزاران بە(٦٦).

وە لەو بنچینانەی ئیمان کەلە کوفر ڕزگارت دەکات: بریتییە لە ئیمان هێنان بە زیندوو بوونەوە وە وەرگرتنی ئەنجام و سزاو پاداشت و لێپرسینەوە و بەهەشت و دۆزەخ کە هەقە.

الله تە عالا دەفەرمووێت:﴿ ۞ مِنۡهَا خَلَقۡنَٰكُمۡ وَفِيهَا نُعِيدُكُمۡ وَمِنۡهَا نُخۡرِجُكُمۡ تَارَةً أُخۡرَىٰ ٥٥ ﴾ طه: ٥٥

واتە: ئێمە ئێوەمان هەر لەم زەویە دروست کردووە، دوای ماوەیەک دەتا نخەینەوە ناوی، پاشان جارێکی تر دووبارە لەو زەویە دەرتان دەهێنینەوە.

وە دەفەرمووێت: ﴿ ۞ وَإِن تَعۡجَبۡ فَعَجَبٞ قَوۡلُهُمۡ أَءِذَا كُنَّا تُرَٰبًا أَءِنَّا لَفِي خَلۡقٖ جَدِيدٍۗ أُوْلَٰٓئِكَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ بِرَبِّهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ ٱلۡأَغۡلَٰلُ فِيٓ أَعۡنَاقِهِمۡۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ أَصۡحَٰبُ ٱلنَّارِۖ هُمۡ فِيهَا خَٰلِدُونَ ٥ ﴾ الرعد: ٥

واتە: خۆ ئەگەر تۆ بە شتێك سەرسام بیت و پێت سەیربێت، ئەوە قسەی بێ باوەڕان جێگەی سەرسامییە کە دەڵێن: ئایا کاتێك بووینەوە بە خاك و خۆڵ، سەرلەنوێ ئایا زیندوو دەکرێینەوە و دروست دەبینەوە؟ ئا ئەوانە کە ئەو قسەیە دەکەن ئەوانەن کە بێ باوەڕ بوون بە پەروەردگاریان، ئا ئەوانە

زنجیرەکان لە گەردنیاندان و ئەوانە نیشـــتەجێی ناو ئاگری دۆزەخن و هەمیشە دەبێ تیایدا بمێنەوە.

لەم ئـایەتەدا بەڵگەی ئەوەی تیـایە کە هەرکەسـێک ئینکاری زیـندوو بوونەوە بکـات کوفرێکی کردووە شــایســتەی ئەوەی بە نەمری لە ئـاگری دۆزەخدا بمێنێتەوە.

الله تەعالا پەنامان بدات لە کوفرو کردەوە کوفرییەکان.

ئەم ئایەتـانە ڕوونکردنەوەی ئەو شتەی تیایە کە پێغەمبەری ﷺ پێ ڕەوانە کردووە لەوەی بە دڵسـۆزییەوە پەرسـتش تەنها بۆ الله ئەنجام بدرێت وە ڕێگری تیایە لە پەرسـتش ئەنجام دان بۆ غەیری الله ، وە بە تەنها عیبادەت بۆ الله ئەنجام بدرێت، ئەمەش ئەو دینەکەیەتی کە خەڵکی بۆ بـانگ کردووە و جیهادی لە دژکردوون لە پێناویدا، هەروەک الله تەعالا دەفەرمــووێــت: ﴿ وَقَـٰتِلُوهُمۡ حَتَّىٰ لَا تَكُونَ فِتۡنَةٌ وَيَكُونَ ٱلدِّينُ كُلُّهُۥ لِلَّهِۚ ﴾ الأنفال: ٣٩

واتە: ئێوەش بجەنگن دژ بەکافران تا فیتنە و شـــیرک نەمێنێت و تا دین و فەرمانبەرداری هەر هەمووی بۆ الله بێت.(وە فیتنەش لێرەدا واتە شیرک).

وە الله تە عالا لە **تەمەنی چل ســاڵێدا ڕەوانەی کرد،** بانگەوازی خەڵکی کرد بۆ دڵسۆزی و واز هێنان لە پەرستشی غەیری الله ماوەی نزیکەی دە ساڵ بەردەوام بوو، پاشان بەرزکرایەوە بەرەو ئاسمان وە پێنج نوێژە

فەرزەکەی لەسەر واجب کرا بە بێ هیچ واسیتەیەک لە نێوان خۆی لەگەڵ اللە تەعالا، پاش ئەوە فەرمانی پێ کرد کۆچ بکات ئەویش کۆچی کرد بەرەو مەدینە، وە فەرمانی پێ کرد بە جیهاد ئەویش لە پێناوی اللە دا بە هەق جیهادی کرد نزیکەی دە ساڵ هەتا خەڵکی پۆل پۆل هاتنە ناو دینی ئیسلامەوە، کاتێ شەست و سێ ساڵی تەمەنی تەواو کرد وە اللە تەعالا دینەکەی پێ تەواو کرد وە هەموو ئەو هەواڵانەی گەیاند کە اللە تەعالای پێی گەیاندبوو بە گیان کێشانی صلوات اللە علیە وسلم.

وە یەکەم پێغەمبەران نوحە عَلَيۡهِ ٱلسَّلَامُ، وە کۆتاشیان محمدە صلى اللە علیه وآله وسلم، وەک اللە تەعالا دەفەرمووێت: ﴿ إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ ﴾ النساء: ١٦٣

واتە: بەڕاستی ئێمە وەحی و نیگامان بۆ تۆ ناردووە هەر وەکو چۆن وەحی و نیگامان بۆ نوح و پێغەمبەرانی دوای ئەو ناردووە..

وە دەفەرمووێت: ﴿ وَمَا مُحَمَّدٌ إِلَّا رَسُولٌ ﴾ آل عمران: ١٤٤

واتە: محمد ﷺ تەنها پێغەمبەرێک بووە..

وە دەفەرمووێت: ﴿ مَّا كَانَ مُحَمَّدٌ أَبَآ أَحَدٖ مِّن رِّجَالِكُمۡ وَلَٰكِن رَّسُولَ ٱللَّهِ وَخَاتَمَ ٱلنَّبِيِّـۧنَۗ وَكَانَ ٱللَّهُ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٗا ٤٠ ﴾ الأحزاب: ٤٠

واتە: محمد وەنەبێ باوکی هیچ کەس لە پیاوانتان بێت بەڵکو پێغەمبەری خوایەو دواهەمینی پێغەمبەرانە، هەمیشەو بەردەوامیش الله بە هەموو شتێک زانایە. وە چاکترینی پێغەمبەران محمدە ﷺ، وە چاکترین کەس دوای پێغەمبەران صلى الله عليهم وسلم بریتییە لە: أبو بكر رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ، وعمر رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ وعثمان رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ، وعلي رَضِيَ ٱللَّهُ عَنْهُ.

وە باشترین کەسانی سەردەمەکان سەردەمەکەی منە واتە سەردەمی پێغەمبەر پاشان سەردەمی دوای ئەو پاشان سەردەمی دوای ئەو.

وە عیسا عَلَيْهِ ٱلسَّلَامُ لە ئاسمانەوە دادەبەزێتەوە و دەجال دەکوژێت.



## والحمد لله رب العالمين.

## تەواو بوو.

## تمت على ما تقدم.



# تعليم الصبيان التوحيد

# منداڵان فێری تەوحید کردن



**وەرگێڕانی**

**حەمزە بەرزنجی**